# کرداره پاداشت زۆره‌کان



نووسینی / محمد صالح المنجد
وەرگێڕانی / عطاء محمد حمه سعید

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی :

خۆشەویستان موسڵمان کەسێکی سادەنی یە هەتا بیر لە ژیان و کارو کردارەکانی نەکاتەوە و وابزانێت ئیشی لە دنیادا تەنها بەسەر بردنی‌یەتی لە شتی بێ هودەو بێ نرخدا و ئارەزووەکانی بکات بە پێوەری ژیانی بەڵکو موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کەوەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموویێت :

﴿ وماخلقت الجن والإنس إلا ليعبدون ﴾

واتــە : مــرۆڤ و جنۆکــەم بــۆ هیــچ دروســت نــەکردووە مەگــەر بــۆ بەندایــەتی نــەبێت . خــۆ ئاشکراشــە ژیــان بــۆ هیــچ کەســێك نەناســراوە و نەبووە وەکو چۆن خــوای گــەورە بــە پێغەمبــەر (ﷺ) دەفەرموێ ﴿ وما جعلنا البشر من قلبك الخلـد ﴾ وەئــەو تەمەنەشـی کە هەیـەتی تەمـەنێکی کەمـەو کاتی‌یـە ، زانستە شەرعیەکان و بەندایەتی یەکانیش زۆرن کە مرۆڤــی موســوڵمان ئەگــەر بــۆی لێ نــەبڕێت ئــەوا

ئەوكاتە زێرینەو ئەوتەمەنە بەنرخەی لە كیس دەچێت وەكو شاعیر دەڵێت :

( العم أن طلبته كثير – والعمر عن تحصيله قليل )

واتە : زانست ئەگەر داوات كردو بەشوێنیدا گەڕای زۆرە – تەمەنیش لە وەرگرتن و بەدیهێنانیدا كەمە .

ئەمە لەلایەك لەلایەكی ترەوە لەگەڵ ئەوەی كەتەمەنی گەلانی پێش خۆمان زۆر بووە بەلاَم خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی چەندین كردارو گوفتاریان بۆ داناوین كە بتوان بەوان بگەینەوە بەڵكو زیاتریش ،ئینجا ئەم ناميلكە خنجیلانەیەش باس لەو گوفتارو كردارانە دەكات كە موسوڵمان بەكردنیان لە تەمەنە كە مەیدا دەگات بەپاداشتێكی زۆرو بەنرخ .

وەهیوادارم بەوەرگێڕانی ئەم ناميلكەیە توانیبێتم خزمەتێك بە ئاینە پاك و بێ گەردەكەی خوای گەورەم كردبێت و موسوڵمانیش بتوانن بە پێی توانا كاری پێ بكەن و تەمەنی پێ نرخدارو بە توێشو بكەن

وەرگێڕ / شعبان / ١٤٢٠

وەلە دواییدا :

هـەموو موسـولْمانێك لەئێمـە زۆر سـورە لەسـەر ئـەوەی تەمـەنی درێـژ بێـت بۆئـەوەی کـە چاکـەی زیـاتری تێـدا بکـات ، وەکـو چـۆن پێغەمبـەر (ﷺ) پرسیاری لیٚ کرا : ((من خیر الناس ؟ قال : ((من طال عمره حسن عمله )) [1] .

واتـە : چاکـترینی خـەڵك کامەیـە ؟ فـەرمووی ((ئەوەی کە تەمەنی درێژبێت و کرداره کانی جوان و چاك بێت )).

بەڵێ ئەم ماڵی دنیایە ماڵی توێشو کۆکردنەوەیە لەکرداره چاکە کان وزۆر کردنیان ؛ هەتا مرۆڤ دڵ ئارام بێت لـەدوای مردنـی ، وەڕازی بێت بەهـەوڵ و کۆششە کانی .

* وە لەڕاستیشدا پێغەمبەر (ﷺ) هـەواڵی داوینـەتێ کـە تەمـەنی گەلـە کـەی لـە نێوانـی شەسـت تاحـەفتا دایە [2] .

---

(١) رواه الترمذی و أحمد بسند حسن

(٢) (نوسـەر ئامـاژە بـۆ ئـەو فەرموودەیـە دەکـات ، کـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت ((أعمال أمتی مابین الستین إلى السبعین ، وأقلهم من یجوز ذلك )) ... صحح سنن إبن ماجه ((٣٤١٤)) وهو حدیث حسن صحیـح ، أنظـر:المشـكاة ((٥٢٨٠)) والسلسلة الصحیحة رقم ((٧٥٧)) ... (وەرگێڕ)

واتە : تەمەنی گەلەکەم لە نێوانی (٦٠ تا ٧٠) دایە ، کەمێکیان لەمە تێدە پەڕن ) ، نەك وەکو تەمەنی گەلانی پێشو ، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) چەند کردارو گوفتارێکی پیشان داوون کە کەمی و ئاسانیانی کۆکردۆتەوە لە گەڵ پاداشتە گەورە کانیان ، کە تەعویزی مرۆڤ دەدەنەوە لەوەی کە لەدەستی چووە لەساڵانێکی زۆر وەکو پێوانێك لەگەڵ گەلانی تردا وەئەم کردارانە ناو دەبرێت بە (الأعمال المضاعفة) .

واتە : کرداره پاداشت زیادە کان یان زۆرەکان وە ئەمانە هەموو مرۆڤێکیش نایان زانێ .

* لە بەر ئەوە حەزم کرد لە باس کردنی زۆر بەیان لەم نامیلکە بچوکەدا وە کو سوور بوونێك لە زیاد بوونی تەمەنی کارکردنی هەر یەکێك لە ئێمە لەم دنیایە دا بۆ ئەوەی لەو کەسانە بین کە دەزانن کەلە کوێوەشان دەخورێت ، ئەو کاتە کرداری ئاسان لەسەردەرون ئەنجام بدەن ، وەگەورەترینییان لە پاداشتدا ، کە نموونەی ئەمەش وەکو ئەوە وایە یەکێك گەوهەری بەنرخ

لەسکی دەریا یەکدا کۆبکاتەوە لەناو کەسانێکدا کە سەدەف کۆ دەکەنەوە ، وەکو چۆن شاعیر دەڵێت :

من لي بمثل سيرك المدلل    تمشي رويدا وتجيء في الأول

* وەئەم کردارانەم یەك لەدوای یەك بەکورتی باسکردووە ، لەگەڵ باسکرن و هێنانی بەڵگەی هەر گوفتار و کردارێك ، لەبەڵگەی قورئانی پیرۆز وە یان فەرمووودەی صەحیح و حەسەنە وە ، وە خوای گەورەش یارمەتی دەرە بۆ هەموو چاکەیەك .

## ١- بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم :-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( من سره أن يبسط له في رزقه ويسأله في أثره ، فليصل رحمه )) [(١)]

واتە : کێ دڵخۆش دەبێت و حەزدەکات ڕزق و ڕۆزی لە سەر فراوان بکرێو شوێنەواری هەر بمێنێتەوە و تەمەنی درێژبێت باسەردانی خزمان و کەس و کار و سیلەی ڕەحمەکەی بەجێبهێنێت .

     

(١) (رواه البخاري ومسلم )




**٢- ڕەوشتی جوان :-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت :

((صلة الرحم وحسن الخلق وحسن الجوار يعمرن الديار ويزدن في الأعمار )) (١)

واتە : سیلەی ڕەحم و ڕەوشتی جوان و جوانی هەڵس و کەوتی دراوسێیەتی ئاوەدانی دەچێنن و تەمەن درێژ دەکەن .

**٣- زۆر نوێژ کردن لە دوو مزگەوتە پیرۆزە ڕێز لێ گیراوەکەدا :-**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

((صلاة في مسجدى هذا أفضل من ألف فيما سواة إلا المسجد الحرام ، وصلاة في المسجد الحرام افضل من مائة ألف فيما سواه )) (٢)

واتە : نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا چاکترو گەورە ترە لە هەزار نوێژی جگە لەم مزگەوتە مەگەر مزگەوتی حەرام نەبێت ، وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرام دا چاکترو گەورەترە لە سەد هەزار نوێژی جگە لە خۆی .

---

(١) (رواه أحمد والبيهقي ).

(٢) (رواه أحمد وابن ماجه )

## ٤- نوێژی جەماعەت لەگەڵ ئیمامدا :-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفرد بسبع وعشرين درجة )) (١)

واتە : نوێژی جەماعەت چاكترو گەورەترە لە نوێژی تاك بەبیست و حەوت پلە .

بەلأم ئافرەتان نوێژە كانیان لە ماڵە كانیاندا چاكترو گەورترە بۆیان لە نوێژكردنیان لە مزگەوت ، ئەگەرچی مزگەوتەكەی پێغەمبەریش بێت (ﷺ) لە بەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوممو حومەیدی - یەكێك لەهاوەڵە ئافرەتەكانە - فەرموو :

((قد علمت أنك تحبين الصلاة معي ، وصلاتك في بيتك خير لك من صلاتك في حجرتك وصلاتك في حجرتك خير لك من صلاتك في دارك ، وصلاتك في مسجد قومك خير لك من صلاتك في مسجدي)) (٢)





---

(١) (رواه البخاری ومسلم)

(٢) (رواه أحمد)

واته : بەڕاستی زانیم کەحەزدەکەیت نوێژم لەگەڵدا بکەی بەلاّم نوێژەکەت لە ماڵەکەتدا چاکترە بۆت لە نوێژەکـــەت لـــە ژوورەکـــەتدا وەنوێژەکـــەت لەژوورەکەتدا چاکترە لە نوێژەکەت لە ماڵە کەتدا بە حەوشـــەو شـــتە کـــانی تـــرەوە ، وە نوێژەکـــەت لەمزگەوتی خێڵەکەتدا چاکترە بۆت لە نوێژەکەت لە مزگەوتەکەی مندا .

* ئیتر ئوممو حومەیید خوای لێ ڕازی بێت لـە دوای ئەمە نوێژی لە بچوکترین و تاریکترین شوێنی ماڵە کەیدا دەکرد هەتا گەیشت بە خوای گەورە .

**٥- کردنی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە :-**

پێغەمبـەر (ﷺ) دەفــەرمووێت : ((فضــل صــلاة الرجل في بيته على صلاته حيث يراه النــاس كفضـل الفريضة على التطوع )) (*)

واتـه : گـەورەیی نوێژی پیـاو (واتـه سـوننەت ) لـە ماڵەکەیدا بەسەر ئەو نوێژەیـدا کـە خـەڵك دیبینـن (واتــە لــە مزگــەتدا ) وەکــو گــە ورەیــی نوێــژی جەماعەت وەهایە بە سەر نوێژی سوننەتدا .

  

(*) (رواه البيهقي وصححه الألباني )

وەئەم فـەرموودە صەحیحـەش کەلـە صـەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە بۆی دەبێتە شاهید (( أفضل الصلاة صلاة المرء في بيته إلا المكتوبة ))

واتە : چاکترین و گەورە ترین نوێژ نوێژی پیاوە لەماڵەکەیدا ومەگەر نوێژی فەرز نەبێت .

**٦- خۆڕازاندنەوە بەهەنگاونان لە ئادابەکانی ڕۆژی هەینی :-**

وە ئەمـەش ئەوەیـە کـە لـەو فەرموودەیـە داهاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ((من غسل يوم الجمعة ، ثم بكر وأبتكر ، ومشى ولم يركب ، ودنامن الإمام ، فاستمع ولم يلغ ، كان له بكل خطوة عمل سنة ، أجر صيامها وقيامها )) [1]

واتـە : هـەر کەسـێك سـەری بشـوات لـە ڕۆژی هـەینیدا ، وەوتراویشـە : واتـە کۆببێتـەوە لەگـەڵ خێزانەکەیدا بۆ ئاوێزان هەتا ئەوەی ببێتە قەڵغان بۆ پاراستنی چاوی لە قەدەغە کراوەکان لەم ڕۆژەدا ئینجا لە سەرەتای کاتەکەوە واتـە : لەبەیانی‌یـەوە بـڕوات وە فریـای سـەرەتای ووتـار بکـەوێت و ئامادەی بێـت ، وە بـە پـێ بڕوات و سوار نـەبێت ، وەنزیك بێتەوە لە ئیمامەوە ، وە گوێ بگرێ و قسە نەکات و خۆی خەریك نەکات .

(١) (رواه أهل السنن )

ئـەوا بەهـەموو هـەنگاوێك كـەدەینێ كـرداری ساڵێكی بۆ دەنووسـرێت ، پاداشـتی ڕۆژووی ئـەو ساڵە و شەونوێژەكەی .

٧- نوێژی چێشتەنگاو (ضحی) :-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت ((يصبح علـى كـل سلامى من أحدكم صدقة ، فكل تسبيحة صدقة ، وكـل تحميدة صدقه ، وكل تهليلة صدقة ، وكل تكبيرة صدقـة ، وأمر بالمعروف صدقة ونهى عن المنكر صدقة ، ويجزيء مـن ذلك ركعتان يركعهما من الضحى )) (*)

واتە : لەسەر هەموو جومگە یەك لە ئێوە (كـە ٣٦٠ جومگـە یـە ) كـە بـەیانی دەكاتـەوە چاكەیەكی لەسـەرە ، هـەموو ((سـبحان الله ))یـەك چاكەیەكە ، وە هەموو ((الحمد لله ))یەك چاكەیەكە ، وەهەموو (لاإله إلا الله) یەك چاكە یەكە ، وە هـەموو ((الله أكـبر)) یـك چاكەیەكـە ، وە فـەرمان كـردن بەچاكەیەك چاكەیەكە ، نەهی كـردن لەخراپەیـەك چاكەیەكە ، وە پاداشتی هەموو ئەمانە دوو ڕكاتـە كە دەیانكات لە نوێژی چێشتەنگاو .

---

(*) (رواه مسلم )

وە چاكترین كاتێكیش بۆنوێژی چێشتەنگاو لەوكاتەدایە كە تەواو گەرما دەكات [١] لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((صلاة الأوا بين حين ترمض الفصال )) [٢]

واتە : نوێژی ئەو كەسانەی كە زۆر دەگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە بەتەوبە لەكاتێكدا یە كە بەچكەی حوشتر لەشوێنی خۆی هەڵدەستێت لەبەر بەهێزی گەرما .

**٨- حەج پەیوەستکردنی ئامادەییەک لەحەڵکی لەسەر حسابی خۆت:-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ((تابعوا بين الحج والعمرة ، فإنها ينفيان الفقر والذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد والذهب والفضة )) [٣]

واتە : حەج و عومرە بكەن بە شوێن یەكدا بەردەوام بن لە سەر كردنیان چونكە ئەم دووانە هەژاری و گوناه ناهێڵن و لای دەبەن هەروەكو چۆن ئاگر پیسی ئاسن و ئاڵتون و زیو لادەبات و نایهێڵێت .

---

(١) (لەپێش نوێژی نیوە ڕۆدا بە كاتژمێرێك یان كەمتریان زیاتر )(وەرگێر)

(٢) (رواه مسلم)

(٣)(رواه الترمذي وصححه الألباني)

وه موسڵمان ناتوانێت كه هەموو ساڵێك حەج بكات ، بـەلاّم باكەمتـەر خـەمی نـەكات لـە وەی كەدەتوانێ لەیارمـەتی دانـی هـەژاری موسـڵمانان و حەج پێكردنیان لەسەر حسابی خۆی .

**٩- نوێژی بەیانی :-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ((من صلی الغداة في جماعة ، ثم قعد يذكر الله حتـى تطلع الشمس ، ثم صلی ركعتين كانت له كأجر حجة وعمرة تامة ، تامة ، تامة)) [(١)]

واته : هەركەسێك نوێژی بەیانی بەجەماعەت بكات ئینجا دابنیشێت و یادی خوا بكات هەتا خۆر هەڵ دێـت ئینجـا دوورکـات نوێژبكـات ئـەوا پاداشـتی حـەجێك وعومریـەكی تـەواو ، تـەواو ، تـەواو ی بۆهەیه .

**١٠- ئامـادە بونـی وانـە زانسـتیەكان لەمزگەوتەكاندا:-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ((من غدا إلی المسجد لايريد إلا أن يتعلم خيرا أو يعلمه كان له كأجر حاج تاما حجته )) [(٢)]

---

(١) (رواه الترمذي وصححه الألباني)

(٢) (رواه الطبراني وصححه الألباني)

واتـه : هەركەسێك بـەيانی بچێـت بۆمزگـەوت و هیچ مەبەستێكی نەبێت مەگەر فێر بوونی چاكەیەك یان یەكێك فێر بكات ئەوا پاداشتی حاجیەكی بۆ هەیە كە حەجێكی تەواوی كردبێت .

## ١١-عومره كردن لەمانگی رەمەزاندا :-

پێغەمبـەر (ﷺ)دەفـەرموێ : ((عمـرة في رمضـان تقضي حجة معي )) [1]

واته : عومرەیەك لەرەمەزاندا وەكو حـەجێك وەهایـه لەگەڵ مندا.

## ١٢- كردنی نوێژە فەرزەكان لەمزگەوت :-

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : ((من خرج من بيته متطهرا إلى صلاة مكتوبة فأجره كأجر الحاج المحرم)) [2] واتـه : هەركەسـێك بـــه دەســـتنوێژەوه بچێتـــه دەرەوه بۆمزگـەوت بۆئـەنجام دانـی نوێـژ ێكـی فـەرز ئـەوا پاداشتی حاجیەكی بۆ هەیە .

---

(١) (رواه البخاري )
(٢) (رواه أبو داود وصححه الألباني )

**١٣- پێویسته لەكەسانی ڕیزی یەكەمی نوێژ بێت :-**

لەبەر ئەوەی (عیرباضی كوڕی ساریه دەفەرمووێت : ((أن رسول الله (ﷺ) كان يستغفر للصف المقدم ثلاثا ، وللثاني مرة )) [1]

واته : پێغەمبەر (ﷺ)سێ جارداوای لێخۆشبونی بۆ ریزی یەكەم دەكرد وه بۆدووەمیش یەكجار . وه پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ((إن الله وملائكته يصلون على الصف الأول )) [2]

واته : خواو فریشتەكانی درود دەدەن لەسەر ڕیزی یەكەم .

**١٤- نوێژكردن لەمزگەوتی قوباء :-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ((من تطهر في بيته ثم أتى مسجد قباء فصلى فيه كان له كأجر عمرة )) [3]

واته : هەركەسێك دەستنوێژ بگرێت لە ماڵەكەی خۆیدا ئینجا بچێتە ناو مزگەوتی قوبائەوه وه نوێژی تێدا بكات ئەوا پاداشتی عومرەیەكی بۆ هەیه .

(١) (رواه النسائي وابن ماجه )
(٢) (رواه أحمد بإسناد جيد)

**١٥- پێویستە بانگوێژبیت :-**

لەبـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفــەرمووێ ((المـؤذن يغفر لە مدى صوتە ، ويصدق من سمعه مـن رطب ويابس ، ولە أجر من صلى معه )) [1]

واتـە : بـانگوێژ خـوای گـەورە لێی خـۆش دەبێـت بەئــەندازەی ڕۆشــتنی دەنگــی وە هــەرچی لــە تەڕووشك بەڕاستگۆی دەزانن و شاهیدی بۆ دەدەن، وە پاداشتی ئەوانەشی بۆ دەنوسـرێت کـە نوێـژی لەگــەڵدا دەکــەن ، ئینجــا ئەگــەر نــاتوانێت ببێتــە بانگوێژ ئەوا کەمتەر خەمی مەنوێنە لەوەی کەوەکو ئەو پاداشتت دەست کەوێت کە ئەویش :

**١٦- پێویستە بڵێیت وەکو وتنی بانگوێژ :-**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ((قل كما يقولون فإذا انتهيت فسل تعطه )) [2]

واتــە : بـانگوێژە کـان چـی دەڵێـن تـۆش وابڵــێ ئینجا کە تەواو بوویت لـە وە لأمدا ئـەوەی بـانگوێ ژەکان ، بپاڕێرەوە و دەتدرێتێ .

---

(١) (رواه أحمد والنسائي )
(٢) (رواه أبو داود والنسائي )

**١٧ –بەرۆژوو بونی رەمەزان و گرتنی شەش رۆژ لە شەووال بەدوایدا :-**

((پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ((من صام رمضان ثم اتبعه ستا من شوال كان كصيام الدهر )) [(١)]

واتە : هەرکەسێك ڕەمەزان بگرێت ئینجا بەدوایدا شەش ڕۆژ لە شەووال بگرێت ئەوا پاداشتی ڕۆژووی ساڵێکی بۆ هەیە .

**١٨– بەرۆژوو بوونی سێ رۆژ لە هەموو مانگێکدا :-**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت (( من صام من كل شهر ثلاثة أيام فذلك صيام الدهر )) ،

( فأنزل الله عز وجل تصديق ذلك في كتابه :

﴿من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها ﴾ (اليوم بعشرة أيام ) [(٢)]

واتە : هەرکەسێك لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت ئەوە وەکو ڕۆژووی هەموو ساڵە کە وەهایە ((ئینجا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ ڕاستێتی ئەمە کە دەفەرمووێ :

﴿ من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها ﴾ ))

************************************************

(١) (رواه مسلم )

(٢) (رواه الترمذي )

واته : هەرکەسێك چاکەیەك بکات ئەوا دە پاداشتی نمونەی ئەوەی بۆهەیە ، ڕۆژێك بەدەڕۆژ .

**١٩- شێوکردن بەڕۆژووەوان :-**

لەبەر ئەوی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

((من فطر صائما كان له مثل أجره غير أنه لاينقص من أجر الصائم شيئا)) [1]

واتـه : هەرکەسێك شێو بەڕۆژووەوانێك بکاتـەوه ئـەوا وەکـو پاداشـتی ئـەوی بۆهەیـە بـەبێ ئـەوەی لەپاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم بکاتەوه .

**٢٠- هەستانی شەوی قەدر :**

خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿ ليلة القدر خير من ألف شهر ﴾ [2]

واته : شەوی قەدر بەڕێزو گەورەترە لە بەندایەتی هەزار مانگ (نزیکەی هەشتاو سێسالْ ).

**٢١- جیهاد و لەز کوشتان :-**

پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرمووێ : ((مقـام الرجـل في الصف في سبيل الله أفضل من عبادة ستين سنة )) [3]

---

(١) (رواه الترمذي وابن ماجه )
(٢) (القدر ، آية :٣)
(٣) (رواه الحاكم وصححه الألباني )

واتە : ((شوێنی پیاو لەڕیزی جیهاد و تێکۆشاندا لە پێناوی خوای گەورەدا گەورەترە لە بەندایەتی شەست ساڵ )) وەئەمە لەگەورەیی شوێنێکە لە ڕیزی جیهاد و تێ کۆشاندا ، ئەی باشە ئەوکەسەی کە لەپێناوی خوای گەورەدا تێ دەکۆشێت چەندین ڕۆژو مانگ و ساڵ ؟

٢٢- **سەنگەر گرتن** :-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : ((من رابط يوماًوليلة في سبيل الله كان له كأجر صيام شهر وقيامه ، ومن مات مرابطاجرى له مثل ذلك من الأجر ، وأجري عليه الرزق وأمن الفتان)) (*)

واتە: هەرکەسێك شەو و ڕۆژێك سەنگەر بگرێت لەپێناوی خوای گەورەدا ئەوا پاداشتی ڕۆژوو شەو نوێژی ساڵێکی بۆ هەیە ، وەهەر کەسێك بمرێت بەسەنگەر گری ئەوا ئەم پاداشتەی بۆ هەیە بەهەمان شێوە ،وە خوای گەورەش لەسزای گۆڕ دەیپارێزێت و دڵنیای دەکات .

 

---

(*) (رواه مسلم)

## ٢٣- کرداری چاکه له ده ڕۆژی مانگی (ذُوالحِجَّة) دا:-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

((مامن أيام العمل الصالح فيهن أحب إلى الله من هذه العشر، فقالوا : يارسول الله ، ولا الجهاد في سبيل الله ؟ فقال : (ﷺ) (( ولا الجهاد في سبيل الله إلا رجل خرج بنفسه وماله ولم يرجع من ذلك بشيء )) [1]

واته : هیچ ڕۆژێك نی یه كه كردار تیایدا خۆشەویست تر بێت لەم دەڕۆژە ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا هەتا جیهاد و تێكۆشانیش لە پێناوی خوادا ؟ فەرمووی هەتا جیهاد و تێكۆشانیش لە پێناوی خوای گەورەدا ، مەگەر پیاوێك بە خۆی و ماڵەكەیەوە بڕوات و بە هیچ یەكێك لەم شتانەوە نەگەڕێتەوە .

## ٢٤- دووباره كردنەوەی هەندێ لەسورەتەكانی قورئان:-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ﴿قل هو الله أحد﴾ تعدل ثلث القرآن ، و﴿ قل ياأيها الكافرون ﴾ تعدل ربع القرآن [2]

---

(١) (رواه البخاري )
(٢) (رواه الطبراني وصححه الألباني )

واتە : سورەتی ﴿ قل هو الله أحد ﴾ سێ‌یەکی قورئانە ، وە ﴿ قل یاأیها الکافرون﴾ چوار یەکی قورئانە .

**٢٥- یادی زیادە (الذکر المضاعف ) واتە زۆر :-**

پێغەمبەر (ﷺ) لەلای جوەیریەی دایکی باوەڕدارانە وە هەستا بەیانیەکیان کاتێك نوێژی بەیانی کرد لەشوێنەکەی خۆیدا ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای ئەوەی کە چێشتەنگاوی کرد گەڕایەوە بۆلای کە جوەیریە هەر دانیشتبوو ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەردەوام لەسەر ئەوحالە بووی کە بەجێم هێشتی لەسەری ؟ ، ووتی : بەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((لقد قلت بعدك أربع كلمات ثلاث مرات لو وزنت بما قلت منذ اليوم لو وزنتهن : سبحان الله وبحمده ، عدد خلقه ، ورضا نفسه ، وزنة عرشه ومداد كلماته )) (*)

واتە : بەڕاستی لەدوای تۆ چوار ووشەم ووت سێ جار ئەگەر بت کێشایە لەگەڵ ئەوەی کە بەدرێژایی ئەمڕۆ ووتت قورس تر دەبوو کە ئەوانیش : ((سبحان الله وبحمده ، عدد خلقه ، ورضا نفسه ، وزنة عرشة ، ومداد كلماته ))

---

(*) (رواه مسلم)

وەلە ئەبی ئومامەوە خوای لێ ڕازی بێت دەڵێ :
پێغەمبەر (ﷺ) بینیمی لە کاتێکدا کە لێوم دەجولاند،
فەرمووی :((ئەوەچی دەڵێیت ئەی ئەبوو ئومامە ؟ ))
ووتم یادی خوادەکەم .
فەرمووی : ((ئایا شتێکت پێ بڵێم کە زۆرتر و
گەورەتر بێت لە یادی خوات لە شەو ڕۆژێکدا ؟
دەڵێیت : الحمد لله عدد خلق ، والحمد لله ملء ما
خلق ، والحمد لله عدد مافي السموات والأرض ، والحمد
لله عدد ما أحصى كتابه ، والحمد لله ملء ما أحصى
كتابه ، والحمد لله عدد كل شيء، والحمد لله ملء كل
شيء ، وەنموونەی ئەمەش ((سبحان الله ))بکە ئینجا
فەرمووی :
((فێریان ببەو ئەوانەی دوای خۆتیشی پێ فێربکە ))

٢٦- ((**داوای لێخۆش بوونی زیاده** )):-

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ ((من أستغفر للمؤمنين
والمؤمنات كتب الله له بكل مؤمن ومؤمنة حسنة )) (*)
واتە : هەرکەسێك داوای لێخۆشبون بۆ
باوەڕدارانی پیاوان و ژنان بکات ئەوا خوای گەورە
بەهەموو باوەڕ دارێکی پیاو و ژن چاکە یەکی بۆ
دەنوسێ .

---

(*) (رواه الطبراني وحسنه الألباني)

**٢٧- جێ بەجێ کردنی پێویستیەکانی خەڵکی :-**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (( لأن أمشي مع أخي المسلم في حاجة أحب إلي من أن اعتكف في المسجد شهرا ))[1]

واتە : لەکاتێکدا کە دەڕۆم لەگەڵ برا موسڵمانە کەمدا بۆ جێ بە جێ کردنی پێویستیەکی لام خۆشەویسترە لە وەی کە مانگێك ئیعتکاف ببەستم لە مزگەوتدا .

**ئەو کردارانەی کە پاداشتەکانیان بەردەوامە هەتالەدوای مردنیش :-**

بەڵگەش ئەمەش لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (( أربعة تجرى عليهم أجورهم بعد الموت : رجل مات مرابطا في سبيل الله ، ورجل علم علما فأجره يجري عليه ماعمل به ، ورجل أجرى صدقة فأجرها يجرى عليه ما جرت عليه ، ورجل ترك ولدا صالحا يدعوله ))[2]

---

(١) (رواه إبن أبي الدنيا وحسنه الألباني )
(٢) (رواه أحمد والبيهقي)

واتە : چوارکەس پاداشتەکانیان بەردەوام بۆیان دەچێت لەدوای مردنیان : پیاوێك لەسەنگەر گرتندا لە پێناوی خوای گەورە دا بمرێت ، وە پیاویك زانستێك بلأو بکاتەوە پاداشتە کەی بۆی دەچێت و بەردەوامە چەند کەس کاری پێ بکەن ، وەپیاوێك چاکە و خێرێك بکات کە کە بەردەوام سودی لێ ببینرێت ئەوا پاداشتە کەی بەردەوام بۆی دەچێت ، وە پیاوێك کورێکی چاکی لەدوای خۆی بەجێهێشتبێت کە بۆی بپارێتەوە

٢٩- **قوازانجەوەی کات** :-

بەوەی کە موسلمان کاتەکانی ئاوەدان بکاتەوە بەگوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە : وەکو خوێندنی قورئان ، وەیاد کردنی خوایگەورە وە بەندایەتی و گوێ گرتنی شریتە سودمەندەکان ، لەبەر ئەوەی کە تەمەن و کاتە کانی بە فیڕۆ نەڕوات و بیان دۆڕێنێ لە ڕۆژێکدا کە دۆڕاندن بەکاری نایەت .

وەکو چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

((نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس : الصحة والفراغ ))

(رواه البخاري)

واتە : دوونیعمەت هەن کە زۆر بەی خەڵکی تیایدا دۆڕاون ئەوانیش : لەش ساغی و دەست بەتاڵیە .

* خوای گەورە لەش ساغمان بکات بۆ درێژ کردنەوەی تەمەنمان لەکردنی کرداری چاکەدا ، وە قوازتنەوەی کاتە پاداشت زۆرەکان ئەوانەی کە زۆرێك لە ساردو سڕەکان لێی بێ ئاگان ، وە درودو سلاو یش لە سەر پێغەمبەرەکەمان محمد بێت وەلەسەر یارو یاوەرانی .

تەواو بوو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار

بحمد الله

